# پرۆژەی لەبەرکردنی

# (50) فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ



ئامادەکردنی
سەنتەری مەدینە

پێداچوونەوەی
م. خالید گەردی

1433 کۆچی - 2012 میلادی



# پڕۆژەی لەبەرکردنی ٥٠ فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ

ئامادەکردنی

سەنتەری مەدینە

پێداچوونەوەی

م. خالید گەردی

١٤٣٣کۆچی ٢٠١٢ زاینی

## (( ناسنامە ))

ناوی کتێب: پڕۆژەی لەبەرکردنی ٥٠ فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ
ئامادەکردنی : سەنتەری مەدینە
پێداچوونەوەی: م. خالید کەردی
چاپ : چاپخانەی رۆژهەڵات-هەولێر
تیراژ: (٥٠٠)دانە
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٨٧٧) ساڵی ٢٠١٢

لەبڵاوکراوەکانی سەنتەری مەدینە(١)

# پێشەکی چاپی دووەم

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ئەم پەنجا فەرموودەی بەردەستت یەکەم پرۆژەی (سەنتەری مەدینە) بوو بەناوی ﴿لەبەرکردنی ٥٠ فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ﴾ ڕاگەیەندرا لەساڵی ڕابردوو کە بەشێوەی نامیلکەیەك کۆکرابوەوە، خۆشبەختانە سەدان کەس بەشداری پرۆژەکەیان کردو و فەرموودەکانیان لەبەر کرد . بەڵام بەهۆی گرنگی پرۆژەکە بە باشمان زانی کە چاپێکی تر لە نامیلکەکە بخەینە بەردەستی موسڵمانانی بەڕێز بۆ زیاتر سود وەرگرتنی موسڵمانان لە پرۆژەکەو زیاتر خزانە نێو دڵی موسڵمانان و لەبەرکردن و تێگەیشتنی ئەو فەرموودانە لەلایەن موسڵمانانەوە.

بەو هیوایەین خوای گەورە بیکاتە توێشوی دوارۆژو بیخاتە سەر میزانی چاکەکانمان وبەشوێنکەوتەی پێغەمبەرﷺمان هەژمار بکا.

سەنتەری مەدینە

٧ی رجب ١٤٣٣ ی کۆچی

٢٠١٢/٥/٣٠ی میلادی

# پێشەکی

## بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

بەڕاستی لەبەرکردنی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ بەڵگەو نیشانەیەکی ڕوونە لەسەر ئەوەی کەوا خاوەنەکەی شوێنکەوتەی پێغەمبەرە ﷺ ، وە یەکێکە لەو خاڵانەی کە دەبێتە هۆی زیادکردنی خۆشەویستی لە پێغەمبەر ﷺ لە دڵی شوێنکەوتوانی ، ئەوەندەش بەسە بۆ مرۆڤ کە خوای باڵادەست دەفەرمووێ ﴿**وما ينطق عن الهوى ان هو الا وحي يوحى**﴾ ، کەواتە ئەوەی تۆ لەبەری دەکەی نیگایە لەلایەن پەروەردگارەوە بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ ئەویش بەئێمەی ڕاگەیاند ، سەرفرازیش بۆ ئەو کەسەیە کە زۆرترین فەرموودەی لەبەر بێت

**م.خالید گەردی**

**٦ی رجب١٤٣٣ کۆچی – ٢٠١٢/٥/٢٩**

## فەرموودەی یەکەم:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَال : قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ {مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلاَ يُؤْذِ جَرَهُ وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِالآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهْ ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْراً أَو لِيَصْمُتْ} متفق عليه ٦١٣٦/٤٧.

ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەڵێ : پێغەمبەر ﷺ فەرمووی هەر کەسێك باوەڕی ساخی بە خوداو بە ڕۆژی دوایی هەیە با بۆ دراوسێ ی خۆی باش بێ و ئازاری نەدا ، هەرکەسێکیش باوەڕی ساخی بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە بارێزی میوانی خۆی بگرێ ، هەرکەسێکیش باوەڕی ساخی بەخواو بە ڕۆژی دوایی هەیە باقسەی باش بکات یا بۆ خۆی بێ دەنگ بێت.

## فەرموودەی دووەم:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ {إذا أَحْسَنَ أَحَدُكُمْ إِسْلاَمَهُ فَكُلُّ حَسَنَة يَعْمَلُهَا تُكْتَبُ لَهُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا إِلَى سَبْعِ مِائَةِ ضِعْفْ ، وَكُلُّ سَيِئَة يَعْمَلُهَا تُكْتَبُ لَهُ بِمِثْلِهَا} متفق عليه١٢٩/٤٢.

لە ئەبو هورەیرەوە (ﷺ) دەڵێ : پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئەگەر کەسێك لە ئێوە موسڵمانەتیەکەی چاك بوو ، ئەوا هەر چاکەیەك دەکات بە (١٠) دە ئەوەندە بۆی دەنوسرێت، تاوەکو (٧٠٠) حەفت سەد ئەوەندە ، وە هەر گوناهێك دەکات وەکو خۆی (یەك بە یەك) بۆی دەنوسرێ.

## فەرموودەی سێیەم:

عَنْ سَالِمْ بْنِ عَبْدِاللّٰه ﷺ قَال : سَمِعْتُ أبا هُرَيْرَة ﷺ يَقُول: سَمِعْتُ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ يَقُول {كُلُّ أُمَتَي مُعافى إلا المُجَاهِرِينْ ، وَإنَ مِنَ الْمُجاهَرَة أَنْ يَعْمَلَ الرَجُلُ باللَّيْلِ عَمَلاً ، ثُمَّ يُصْبِحُ وَقَدْ سَتَرَهُ اللهُ عَلَيْه ، فَيَقُولَ : يَا فُلاَنْ عملْتُ الْبارحةَ كَذا وكَذا، وقَدْ بات يسْتُرُهُ رَبُهُ ويُصْبِحُ يَكْشِفُ سِتْرَاللهِ عَنْهُ} متفق عليه ٦٠٦٩/٢٩٩

له (سالم كوڕی عبدالله) ﷺ دەڵێ بیستم له پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو ئوممەتی من هەمووی بەر عەفوو و لێبوردنی خودا دەکەون ، مەگەر ئەوانەی کە سڕی خۆیان هەڵدەماڵن (کەشف دەکەن) ، وەك ئەوەی پیاوێك لەشەودا کارێکی ناشرین دەکات و خودا بۆی دادەپۆشێ ، کەچی کابرا بۆ بەیانی دەچێ تاوانی خۆی ئاشکرا دەکاو دەیگێڕێتەوە بۆ ئەم و ئەو ، دەڵێ ئەی

فولان من دوێنێ شەو ئیشێکی وام کرد ، تەماشا بکەن ئەو کەسە خودا بە شەو پەردە پۆشی بۆ دەکا ، کەچی ئەو ئەوەندە بێ ئاگایە دەچی پەردەی خوا لەسەر گوناه و شورەیی خۆی هەڵدەداتەوە.

## فەرموودەی چوارەم:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنِ النَبي ﷺ قالَ {إِذَا أَحَبَ اللهُ الْعَبْدَ نادى جُبْرِيلْ : إِنَّ اللهَ يُحِبُ فُلاَنا فَأَحْبِبْهُ ، فَيُحِبُهُ جُبْرِيلُ ، فُيُنادي جُبريل فِي أَهْلِ السَماءَ إِنَ اللهَ يُحِبُ فُلاَناً فَأَحِبُوهُ ، فَيُحِبُهُ أَهْلُ السَماء ، ثُمَ يُوضَعُ لَهُ القَبولْ فِي الأَرض} متفق عليه ٣٢٠٩/٢٦٣٧.

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ : پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : کاتێك خوای گەورە بەندەیەکی خۆش ویست بانگی جوبرائیل دەکاو دەفەرمووێ: ئەی (جوبرائیل)

خوای گەورە فولان بەندەی خۆش دەوێ دەی تۆش خۆشت بوێ .. ئیتر جوبرائیل خۆشی دەوێ و جارِ دەدا بەناو خەڵکی ئاسماندا: خودا فولان بەندەی خۆش دەوێ کەواتە ئێوەش خۆشتان بوێ .. ئیتر خەڵکی ئاسمانیش هەموو خۆشیان دەوێ .. ئەوجا لەناو دانیشتووانی زەویدا ڕەزای سوك و شیرین دەبێ و بەشێوەی گشتی لەناو خەڵکیدا پەسەند دەکرێ.

## فەرموودەی پێنجەم:

قَالَ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ {يَأْتِيَ الشَيْطَانُ أَحَدَكُمْ فَيَقُولُ ، مَنْ خَلَقَ كَذَاَ ، مَنْ خَلَقَ كَذَا ، حَتى يَقُولَ ، مَنْ خَلَقَ رَبُكْ؟ فَإِذا بَلغَهُ فَلْيَسْتَعِذْ باللهِ وَلْيَنْتَهِ} متفق عليه ١٣٤/٣٢٧٦.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ : پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : شەیتان دێ بەلای یەکێکتانەوە دەڵێ : کێ ئەمەی دروست کردووە؟ کێ ئەوەی دروست کردووە؟ هەتا بەرەبەرە دەڵێ کێ خودای تۆی دروست کردووە ؟ کە کار گەیشتە ئەو ڕادەیە پەنا بگرن بەخوداوو بڵێن (أعوذ بالله من الشیطان الرجیم) و وازبێنن.

## فەرموودەی شەشەم:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَبي ﷺ قَالَ {لَيْسَ الْغِنى عَنْ كَثْرَةِ الْعَرَضِ ، وَلكِنَ الْغِنى غِنَى النَفْسٍ} متفق عليه ٦٤٤٦/١٠٥٦.

لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ لە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : دەوڵەمەندی لەزۆری شت و مەك نیە ، بەڵكو دەوڵەمەندی.. دەوڵەمەندی دڵ و دەروونە .

## فەرموودەی حەوتەم:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِي ﷺ قَالَ { **لاَ يَقْبَلُ اللهُ صَلاَةَ أَحَدِكُمْ إِذا أَحْدَثَ حَتَى يَتَوَضَأْ** } متفق عليه ٦٩٥٤/٢٢٥.

**لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ لە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : خوای گەورە نوێژی یەکێکتان قەبوڵ ناکات ئەگەر دەست نوێژی شکا تاوەکو دەست نوێژ دەشواتەوە .**

## فەرموودەی هەشتەم:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَبِي ﷺ قَالَ {**إِنَّ اللهَ تَجاوَزَ عَنْ أُمَتِي مَا حَدَثَتْ بِهِ أَنْفُسَهَا ، مَا لَمْ تَعْمَلْ أو تَتَكَلَمَ**} متفق عليه ٥٢٦٩/١٢٧.

له ئەبو هورەیرەوە ﷺ له پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : خوای گەورە چاوپۆشی کردووە له ئۆممەتم لەو شتانەی کە بە خەیاڵیان دادێ ، تا وەکو نەیکەن بە کردەوە یان نەیڵێن.

## فەرموودەی نۆیەم:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أن رسول الله ﷺ قَالَ { لِكُلِ نَبِيٍ دَعْوَةٌ مُسْتَجَابَةٌ يَدْعُوُ بِهَا ، وَأُرِيدُ أَنْ أَخْتَبِئَ دَعَوْتِي شَفَاعَةٍ لِأُمَتِي فِي الْآخِرَةِ} متفق عليه ١٩٩/٦٣٠٤.

له ئەبو هورەیرە ﷺ له پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : بۆ هەموو پێغەمبەرێك نزایەكی وەڵامدەرەوەی هەیە كە دەیكات ، منیش دەمەوێ نزایەكەم بهێڵمەوە وەكو تكا بۆ ئۆممەتەكەم له ڕۆژی دواییدا.

## فەرموودەی دەیەم:

عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ رسول الله ﷺ قَالَ فَذَكَرَ أَحاديثَ مِنْهَا وَقَالَ {أَقِيموا الصَفَّ في الصَلاَة فَإنَّ إقامَةَ الصَفِ مِنْ حُسْنِ الصَلاَة} متفق عليه ٧٢٢/٤٣٥.

**ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕاویەوە لە پێغەمبەر ﷺ لەچەند فەرموودەیەکدا لەوانە فەرمووی : ڕیز لە نوێژدا ڕاست بکەن چونکە ڕاستی ڕیزەکان لەجوانی نوێژدایە .**

## فەرموودەی یازدەیەم:

هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ : سَمِعْتُ رَسول الله ﷺ ، يَقولُ { الحَلفُ مُنَفقَةٌ لِلْسلْعَة ، مُمْحقَةٌ لِلْبَرَكَة} متفق عليه ١٦٠٦/٢٠٨٧.

لە ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی : سوێندی درۆ برەو بەفرۆشتنی کالاّ دەدات بەلاّم پیت و بەرەکەتی مامەڵە دەبات.

## فەرموودەی دوازدەم:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ ﷺ عَنِ النَبِي ﷺ قَالَ {تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لِأَرْبَعْ : لِمَالِهَا وَلِحَسَبِهَا وَجَمَالِهَا وَلِدِينِهَا ، فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِينِ ، تَرِبَتْ يَدَاكْ} متفق عليه ٥٠٩٠/١٤٦٦.

لە ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی : واباوە لەناو خەڵکا کە ژن لەبەر ئەو چوار شتە مارە دەکرێ و دەخوازرێ ، لەبەر ئەوەی کە ماڵی هەیە یا لەبەر ئەوە کە خانەدانە یا لەبەر ئەوە کە جوانە یا لەبەر ئەوە دیندارە ، جا تۆ بتوانە ئافرەتێکی خاوەن دین بێنە ئەگەر وا نەکەی دەستت بچێتە ناو خۆڵ .

## فەرموودەی سێزدەم:

عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ قَالَ ﷺ أَنَّ رسول الله ﷺ قَالَ {مَنْ لاَ يَرْحَمْ لا يُرْحَمْ} متفق عليه ٥٩٩٧/٢٣١٨.

**لە ئەبو هورەیرە ﷺ وتی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئەوەی ڕەحم بەکەس نەکات ، ئەوا ڕەحمی پێ ناکرێ.**

## فەرموودەی چواردەم:

عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ : قَالَ رَسول الله ﷺ {إِذا دَخَلَ رَمَضَانُ فُتِحَتْ أَبْوابُ الْجَنَة ، وَغُلقَتْ أَبْوابُ جَهَنَمْ وَسُلْسِلَتِ الشَيَاطِينْ} متفق عليه ٣٢٧٧/١٠٧٩.

**لە ئەبو هورەیرە لە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی : کاتێك کە مانگی ڕەمەزان داهات دەرگاکانی**

بەهەشت دەکرێنەوەو دەرگاکانی دۆزەخ دادەخرێن و شەیتانەکان کۆت و زنجیر دەکرێن.

## فەرموودەی پانزەم:

عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنِ النَبي ﷺ قَالَ {إِذا نَسِيَ فَأَكَلَ وَشَرِبَ ، فَلْيُتِمَ صَوْمَهَ ، فَإِنَّمَا أَطْعَمَهُ اللهُ وَسَقَاهُ} متفق عليه ١١٥٥/١٩٣٣.

له ئەبو هورەیره ﵁ له پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی : ئەگەر کەسێ لەبیری نەبوو کە بە ڕۆژووەو شتێکی خوارد یا ئاوی خواردەوە ، ئەوا با ڕۆژووەکەی نەشکێنێ ، ئەو نان و ئاوەش کەوا خواردیتی رزق و ڕۆزیەك بووە خوا بۆی ڕەخساندووە.

## فەرموودەی شانزەم:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قال : قَالَ رَسول الله ﷺ{ مَنْ حَجَ هَذَا الْبَيْتَ، فَلَمْ يَرْفُثْ ، وَلَمْ يَفْسُقْ رَجَعَ كَمَا وَلَدَتْهُ أُمُهُ} متفق عليه ١٨١٩/١٣١٩.

**لە ئەبو هورەیرە ﷺ وتی بیستم لە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : هەر کەسێك حەجی ئەو بەیتە بکات ، لەکاتی حەجەکە پارێز لە کەیف کردن لەگەڵ ژندا بکاو پارێز لە قسەی پڕوپوچ بکاو گوناه نەکات ، ئەوا وەك ئەو ڕۆژەی کە لەدایك بووە لە گوناه پاك دەبێتەوە.**

## فەرموودەی حەڤدەم:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ : قَالَ رَسول الله ﷺ {يُسَلِّمُ الرَّاكِبُ عَلى الْماشي ، وَالْماشي عَلى القاعِدْ ، وَالْقَليلُ عَلَى الكَثير} متفق عليه٢١٦٠/٦٢٣٢.

له ئەبو هورەیرە ﷺ له پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی : با ئەوەی بەسوارییە سلاَو له پیادە بکات لەکاتی بەیەك گەیشتندا ، ڕۆیشتوو سلاَو لەدانیشتوو بکات ، کەسانێکی ژمارە کەم سلاَو له کەسانێکی ژمارە زۆر بکەن.

## فەرموودەی هەژدەم:

عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ ﷺ أنَّ رسول الله ﷺ قالَ {يُسْتَجابُ لِأَحَدِكُمْ مَا لَمْ يَعْجَلْ ، يَقُولُ : دَعَوْتُ فَلَمْ يُسْتَجَبْ لي} متفق عليه ٦٣٤٠/٢٧٣٥.

له ئەبو هورەیرە ﷺ له پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی : نزاو پاڕانەوەتان گیراو دەبێ بەمەرجێ پەلەنەکەن ، وەك ئەوە بڵێ کەمن هەر دوعا دەکەم و هەر گیراو نەبووە.

## فەرموودەی نۆزدەم:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عن النبي ﷺ قالَ {لاَ تَقُومُ السَاعَةُ حَتَى يَمُرُّ الرَّجُلُ بِقَبْرٍ الرَجُلِ فَيَقُولُ : يَا لَيْتَنِي مَكَانَهُ} متفق عليه ١٥٣/٧١١٥.

لە ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی : قیامەت هەڵناستێ تاوەکو وای لێ دێ پیاو بەلای گۆڕی پیاودا دەڕوات و دەڵێ : خۆزگە لە جێی ئەودا بووم.

## فەرموودەی بیست:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أن رَسول الله ﷺ قالَ {لاَ يَتَمنى أَحَدَكُمُ الْمَوتَ إِمَّا مُحْسِناً فَلَعَلَهُ يَزْدَاد ، وَإِما مُسيئاً فَلَعَلَهُ يُسْتَعْتِبْ} متفق عليه ٢٦٨٢/٧٢٣٥.

لە ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی : کەستان مەرگ بە ئاوات نەخوازن ، یان کەسێك چاکەکارە یان پتر چاکە دەکات ، یان کەسێك خراپە کارە بەڵکو خوای گەورە مۆڵەتی بدات تاوەکو تەوبە بکات.

## فەرموودەی بیست و یەك:

عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ ﷺ عن رَسول اللّٰه ﷺ قال {لاَ تَقُومُ السَاعَةُ حَتى تُقاتلوا الْيَهود ، حَتَى يقولَ الْحَجَرُ وَرَاءَهُ الْيَهودي : يا مُسْلِمْ ، هذا يَهوديٌ وَرَائي فَاقْتُلْهُ} متفق عليه ٢٩٢٦/٢٩٢٢.

لە ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی : قیامەت هەڵناستێ تاوەکو بەگژجولەکەدا نەچن ، تاوەکو بەرد کە جوولەکە لەدوایەوە خۆی

شاردۆتەوە ، دەڵێ : ئەی موسڵمان ئەوە جوولەکەیە لەدواوە خۆی حەشارداوەو وەرە بیکوژە.

## فەرموودەی بیست و دوو:

عَنْ أبي هُرَيْرَةَ ﷺ قال رَسول اللهِ ﷺ : {يَتَقَارَبُ الزَمَانُ ، وَيَنْقصُ الْعَمَلُ ، وَيُلْقى الشُّحَّ وَيَكْثُرُ الْهَرَجُ، قالوا : وَمَالْهَرَجْ؟ قالَ : القَتْلُ القَتْل} متفق عليه ١٥٧/٧٠٦١

لە (ئەبو هورەیرەوە) گوتی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : کات و وەخت بەری کورت دەبێ ، وە کردەوەی چاك کەم دەبێ وە بەخیلی و چاو چنۆکی دەخرێتە ناو دلاْن وە (الهرج) زۆر دەبێ ، وتیان (الهرج) چیە؟ فەرمووی کوشتن کوشتن.

## فەرموودەی بیست و سێ:

عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ : سَمعْتُ رَسول الله ﷺ يقول {لاَ يَزالُ قَلْبُ الْكَبيرِ شَاباً في اثْنَتَيْن : في حُبِ الدُنْيا وَطولِ الْأمَلْ} متفق عليه ٦٤٢٠/١٠٤٦.

**له (ئەبو هورەیرە رضي الله عنه) گوتی بیستم لە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو : بەردەوام دڵی پیر وەکو گەنج وایە لە دوو شت : خۆشەویستی دونیاو هیوای دووردرێژ.**

## فەرموودەی بیست و چوار:

عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه عن النبي ﷺ قالَ {لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ بِالْصَلاَة فَتُقَامْ ، ثُمَّ أُخَالفُ إلى مَنَازلَ قَوْمٍ لاَ يَشْهَدونَ الصَلاَةُ فَأُحَرِقَ عَلَيْهِمْ} متفق عليه ٦١٥/٢٤٢٠.

لە ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی : نیازم وابوو کە فەرمان بکەم بە نوێژ کە دابیەستن ، پاشان خۆم بڕۆم بۆ سەر ماڵی پیاوانێك کە نایەن بۆ نوێژی جەماعەت تاوەکو ماڵەکانیان بەسەردا بسوتێنم.

## فەرموودەی بیست و پێنج:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عن النبي ﷺ قالَ {يَأْتِي عَلى النَّاسِ زَمَانٌ ، لاَ يُبَالِي الْمَرْءُ مَا أَخَذَ مِنْهُ ، أَمِنَ الحَلاَلِ أَمْ مِنْ الحَرَامْ} رواه البخاري ٢٠٥٩.

لە ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی : مەردوم دەکەوتنە چەرخ و سەردەمێکی واوە مرۆڤ دەربەستی ئەوە نایەت کە ئەو ماڵەی پەیدا دەکات حەلاڵە یان حەرامە.

## فەرموودەی بیست و شەش:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عن النبي ﷺ قالَ {مَنْ أَطَاعَني فَقَدْ أَطَاعَ اللهَ ، وَمَنْ يَعْصِني فَقَد عَصى اللهَ ، وَمَنْ يُطِعِ الأميرَ فَقَدْ أَطَاعَني ، وَمَنْ يَعْصِ الأميرَ فَقَدْ عَصَانِي} رواه المسلم ١٨٣٥.

لە ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی : هەرکەسێك گوێڕایەڵی من بکا ئەوا گوێڕایەڵی خوا دەکا ، وە هەر کەسێ لەفەرمانی من دەربچێ ئەوا لەفەرمانی خودا دەرچووە ، وە هەر کەسێك گوێڕایەڵی فەرمانڕەوای بکا ، ئەوا گوێڕایەڵی من دەکا، وە هەر کەسێ لەگوێڕایەڵی فەرمانڕەوای دەربچێ ئەوا لە فەرمانی من دەرچووە.

## فەرموودەی بیست و حەوت:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قال : قَالَ رَسول الله ﷺ {لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أعْلَمْ لَضَحِكْتُمْ قَليلاً ، وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيراً} رواه البخاري ٦٤٨٥.

له ئەبو هورەیره ﷺ له پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی : ئەگەر ئێوە ئەوە بزانن کە من دەیزانم ، ئەوا کەم پێدەکەنن و زۆر دەگریێن.

## فەرموودەی بیست و هەشت:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عن النبي ﷺ قالَ {مَا أَنْزَلَ اللهُ دَاءً إلاَّ أَنْزَلَ لَهُ شِفاءً} رواه البخاري ٥٦٧٨.

له ئەبو هورەیره ﷺ له پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی : خوای گەورە هیچ دەردێکی نەناردووە ئیللا شیفای بۆ داناوە

## فەرموودەی بیست و نۆ:

عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ ﷺ قال : قَالَ رَسول اللهِ ﷺ {أُنْظُروا إلى مَنْ أَسْفَلَ مِنْكُمْ ، وَلاَ تَنْظُروا إِلى مَنْ هُوَ فَوْقَكُمْ ، فَهُوَ أَجْدَرُ لا تَزْدَروا نِعْمَةَ اللهِ} رواه مسلم ٢٩٦٣.

له ئەبو هورەیره ﷺ دەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : سەیری ئەو کەسانە بکەن کە لەخوار خۆتانن ، وە سەیری ئەو کەسانە مەکەن کە لەسەرەوەی ئێوەن ، ئەوەیان باشترە تاوەکو نیعمەتی خوای گەورە بەکەم نەزانن.

## فەرموودەی سی:

عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ ﷺ عن النبي ﷺ قال {قالَ اللهُ : أَعْدَدْتُ لِعبادِيَ الْصَالِحينْ مَا لاَ عَيْنُ رَأَتْ ، وَلاَ أُذُنُ

سَمِعَتْ ، وَلاَ خَطَرَ عَلى قَلْبِ بَشَرٍ} رواه البخاري ٧٤٩٨.

**له ئەبو هورەیرە ﷺ له پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی : خوای گەورە فەرمووی ئامادەم كردووە بۆ بەندە چاكەكانم كە هیچ چاوێك نەیبینیوە، وە هیچ گوێچكەیەك نەیبیستووە ، وە بە دڵی هیچ كەسێكدا نەهاتووە .**

## فەرموودەی سی و یەك:

عن أبي هريرة ﷺ عن النبي ﷺ قالَ {إنَّ الدينَ يُسْرٌ ، وَلَنْ يُشَادَّ الدينَ أَحَدٌ إلاَّ غَلَبَهُ ، فَسَدِدوا وَقَاربوا ، وَأبشِروا ، واسْتَعينوا بالْغَدْوَةِ وَالْرَوْحَةِ وَشيْءٍ مِنَ الْدُلْجَة} رواه البخاري

لە ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی : بەڕاستی ئایین ئاسانە ، هیچ کەس دین لەسەر خۆی توند ناکات ئیللا دین بەسەری زاڵ دەبێت ، کەواتە قسەی ڕاست بکەن و نزیك بکەنەوە لە خۆتان موژدە بدەن ، هەوڵبدەن تایبەت لە بەیانیان و ئێواراندا کەمێکیش لەشەواندا

## فەرموودەی سی و دوو:

عن أبي هريرة ﷺ عن النبي ﷺ قالَ {تَعَوَّذُوا باللهِ مِنْ جَهْدِ الْبَلاَءْ ، وَدَرَكِ الشقَاءْ ، وَسُوءِ الْقَضَاء ، وَشَمَاتَهِ الأَعْداء} متفق عليه ٢٧٠٧/٦٦١٦.

لە (ئەبوهورەیرەوە) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرمووی : پەنا بەخوا بگرن لە بەلاّی قوڕسی لە تووشبوونی نەگبەتی و لەیەخەگرتنی چارە ڕەشی و لەچارەنووسی خراپ و لە پێخۆشبوون و شانەکانی دوژمنان.

## فەرموودەی سی و سێ :

عن أبي هريرة ﷺ عن النبي ﷺ قالَ {لاَ تَرْغَبوا عَنْ آبائِكُمْ ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ أَبيهِ فَهُوَ كُفْرٌ} متفق عليه ٦٢/٦٧٦٨.

له ئەبو هورەیره ﷺ له پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی : خۆتان مەکەن بە کوڕی کەسانێك غەیری باوکی خۆتان چونکە هەر کەسێك نەسەبی خۆی بکاتە غەیری باوکی خۆی و بشزانێ ئەوا کوفری کردووە.

## فەرموودەی سی و چوار :

عن أبي هريرة ﷺ عن النبي ﷺ قالَ {مَنْ اَخَذَ أَمْوالَ النَاسِ يُريدُ أَدَاءها أَدى اللهُ عَنْهُ ، وَمَنْ أَخَذَ يُريدُ إِتْلاَفَهَا أَتْلَفَهُ اللهُ} رواه البخاري ٢٣٨٧.

لە ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی : کەسێ ماڵی کەسێ وەربگرێ و لەدڵەوە نیازی دانەوەی هەبێ ، ئەوا خوا بۆی هەڵدەسوڕێنێ و دەیداتەوە ، بەلاّم ئەوەی کە دەیەوێ بیبا بۆ ئەوەی لەناوی ببا ، ئەوا خودا خۆی لەناوی دەبات.

## فەرموودەی سی و پێنج :

عن أبي هريرة ﷺ قال : قَالَ رَسولُ اللّٰه ﷺ {مَنْ تَابَ قَبْلَ أَنْ تُطْلِعُ الشَمْسُ مِنْ مَغْرِبِهاً ، تَابَ اللّٰهُ عَلَيْهِ} رواه مسلم ٢٧٠٣

لە ئەبو هورەیرە ﷺ گوتی : پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : کەسێك تەوبە بکات پێش ئەوەی ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە هەڵبێ، خوای گەورە تەوبەی وەردەگرێ.

## فەرموودەی سی و شەش :

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أن رَسول الله ﷺ قالَ {إِذَا قالَ الرَجُلُ : هَلَكَ النَاسْ فَهُوَ أَهْلَكَهُمْ} رواه مسلم ٢٦٢٣.

له ئەبو هورەیره ﷺ له پێغەمبەرەوه ﷺ فەرمووی : کەسێك بلّێ خەڵك له خراپەدا وا فەوتان ئەوا ئەو فەوتاوه یان ئەو له هەمووان لەخراپەدا فەوتاوتره.

## فەرموودەی سی و حەوت :

عن أبي هريرة ﷺ قال : قَالَ رَسولُ الله ﷺ {مَنْ خَلَفَ عَلى يَمينٍ ، فَرَأَى غَيْرَهَا خَيْراً مِنْهَا ، فَلْيَأْتِ الذي هُوَ خَير، وَلْيُكَفِرْ عَنِ يَمينه} رواه مسلم ١٦٥٠.

له ئەبو هورەیره ﷺ گوتی : پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : هەر کەسێ سوێندی لەسەر شتێ خوارد پاشان بینی بێجگه لەو شته باشتره ، با چاکتره ئەنجام بداو کەفالەتی سوێندەکه بدات.

## فەرموودەی سی و هەشت :

عن أبي هريرة ﷺ يَقولُ : قَالَ رَسولُ اللهِ ﷺ {خَيْرُ يَوْمٍ طَلَعَتْ عَلَيْهِ الشَمْسُ يَوْمُ الْجُمُعَة ، فِيهِ خُلِقَ آدَمْ ، وَفِيهِ أُدْخِلَ الْجَّنة ، وَفِيهِ أُخْرِجَ مِنْهَا} رواه مسلم ٨٥٤.

**لە ئەبو هورەیرە ﷺ گوتی : پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : چاکترین ڕۆژ ڕۆژی لێ هەڵهاتبێ ، ڕۆژی هەینییە ، لەو ڕۆژەدا ئادەم خولقێنرا ، وە لەو ڕۆژەدا بردرا بۆ بەهەشت ، وە لەو ڕۆژەدا دەرهێنرا لە بەهەشت.**

## فەرموودەی سی و نۆ :

عن أبي هريرة ﷺ قال : قَالَ النبي ﷺ {مَا مِنْ مَولودٍ إلا يُولَدُ عَلى الفِطرة ، فأبواهُ يُهَودانِه أَو يُنَصرانِه ، أَوْ يُمَجسانِه ...} متفق عليه ٢٦٥٨

له ئەبو هورەیرە ﷺ گوتی : پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : هیچ منداڵێك لە دایك نابێ تەنها لەسەر سروشتی خواناسی نەبێ ، ئینجا دایك و باوكی دەیكەن بە جولەكە یان بە گاورٍ یان بە ئاگر پەرست .

## فەرموودەی چل :

عن أبي هريرة ﷺ أَنَ رَسول الله ﷺ قالَ {قال اللهُ : أَنْفِقْ يَا ابْنَ آدَمْ أُنْفِقْ عَلَيْك} متفق عليه ٩٩٣/٥٣٥٢.

له ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی : خوای گەورە دەفەرمووێ ئەی نەوەی ئادەم ببەخشە پێت دەبەخشم.

## فەرموودەی چل و یەك :

عَن عبدالله ابْنِ عُمَر ﷺ عن النبي ﷺ قالَ {لاَ يُقيمُ الرَّجُلُ الرَجُلَ مِنْ مَقْعَدِه ، ثُمَّ يَجْلِسُ فيهِ وَلكِنْ تَفَسَحُوا وَتَواسَعوا} متفق عليه ٦٢٦٩/٢١٧٧.

له (عبدالله ی کوڕی عمر) ﷺ له پێغەمبەرەوه ﷺ فەرمووی: با کەسێك کەسێك له جێگای خۆی هەڵنەستێنێ ، تا بەخۆی له جێگاکەی دابنیشێ ، بەلاٌم مەجلیسەکه فراوان بکەن و جێگای بۆ بکەنەوه.

## فەرموودەی چل و دوو :

عَن عبدالله ابْنِ عُمَر ﷺ قال : أنَ النبي ﷺ قالَ {إذا كُنْتُمْ ثَلاَثَةُ فَلاَ يَتَناجى اثْنانِ دُونَ صَاحِبُهُمَا فَإنَ ذَلكَ يُحْزِنْهُ} متفق عليه ٦٥٨٨/٢١٨٣.

له (عبدالله ی کوڕی عمر) ﵄ گوتی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر سێ کەس بوون با دووانیان بە نهێنی و بە چرپە لەگەڵ یەکتر قسە نەکەن چونکە ئەمە دەبێتە هۆی خەفەت بارکردنی سێیەمیان.

## فەرمووده‌ی چل و سێ :

عَن ابْنِ عُمَر ﵄ أنَ رَسول الله ﷺ قالَ {إنَّمَا مَثَلُ صَاحِبِ القُرْآنَ، كَمَثَلِ صَاحِبِ الإبلِ المُعَلَّقَةَ ، إنْ عَاهَدَ عَلَيْها أمْسَكَهَا ، وَإنَ أطْلَقَهَا ذَهَبَتْ} متفق عليه ٧٨٩/٥٠٣١.

له (عبدالله ی کوڕی عمر) ﵄ له پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی: نمونەی قورئان خوێن وەك نمونەی خاوەن وشتر وایە کە وشترەکەی بە پەتێ بەستبێتەوە چۆن ئەگەر سەرەو کاری وشترەکەی بکا ئەوا وشترەکەی بۆ دەمێنێ ،

بەلاّم ئەگەر بەرەلاّی بکا وشترەکەی لەدەست دەردەچیّ ، قورئانی پیرۆزیش هەروایە ئەگەر خاوەنەکەی خەریکی بیّت و چاودیّری بکات ئەوا لەبەری دەمیّنیّ دەنا بەرە بەرە لەبیری دەچیّتەوە.

## فەرموودەی چل چوار :

عَن ابْنِ عُمَر ﷺ أنَ رَسول الله ﷺ قالَ {إنَ الْغَادرَ يُنْصَبُ لَهُ لِواءُ يَوْمَ الْقيامَةِ ، فَيُقالُ : هَذه غَدَرُهُ فُلانُ بْنُ فُلانْ} متفق عليه ١٧٣٥/٦١٧٨.

له (عبدالله ی کوڕی عمر) ﷺ لە پیّغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی: لە ڕۆژی قیامەتدا هەموو ستەمکارو بیّ پەیمانیّك ئالاّیەکی تایبەتی خۆی هەیە هەلّدەگریّ لەدیاری پیّی دەناسریّتەوە ، دەلّیّن ئەمە نیشانەی ستەمی فولانی کوڕی فولانە.

## فەرموودەی چل و پێنج :

عَن عبدالله بْنَ عُمَرْ ﷺ أنَ رَسولَ الله ﷺ قالَ {الذي تَفُوتُهُ صَلاَةُ الْعَصْرِ ، كَأَنَّمَا وُتِرَ أَهْلُهُ وَمَالُهُ} متفق عليه ٦٢٦/٥٥٢.

له (عبدالله ی کوڕی عمر) ﷺ له پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی: هەر کەسێ نوێژی عەسری بچێ وەك ئەوە وایە کە بە تەنیا مابێتەوەو کەس و کاری و ماڵی هەموو لەدەست دابێت.

## فەرموودەی چل و شەش :

عَن ابْنِ عُمَر ﷺ قالَ : قالَ رَسول الله ﷺ {لَنْ يَزالَ الْمُؤْمِنُ في فُسْحَةٍ مِنْ دينِهِ ، مَا لَمْ يُصِبْ دَماً حَراماً} رواه البخاري ٦٨٦٢.

له (عبدالله ی کوڕی عمر) ﷺ گوتی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: موسڵمان هەتا خوێن ڕشتنی نارەوا نەبێ بەتوشیەوە ، هێشتا ئابینی بە بەرییەوە دەمێنێ.

## فەرموودەی چل و حەوت :

عَن ابْنِ عُمَر ﷺ قالَ : كان مِنْ دُعاءِ رَسول ﷺ {اللّهُمَ إنِي أَعُوذُبكَ مِنْ زَوال نعْمَتكْ ، وَتَحوِّيلِ عَافِيَتكْ، وَفجاءَةُ نِقْمَتِك ، وَجَمِيعِ سَخَطِكَ} رواه مسلم ٢٧٣٩.

له (عبدالله ی کوڕی عمر ﷺ) فەرمووی یەکێك له دوعاکانی پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو : پەروەردگارا بەتۆ پەنا دەگرم لەلاچوونی نیعمەتی ئیسلام بەسەرمەوە ، وە گۆڕانی حاڵەتی باش بۆ نالەبار ، وە لەتۆڵە سەندنەوەی لەناکاو ، وە لە هەموو ئەو کارانەی دەبێتە هۆی توڕەیی تۆ.

## فەرموودەی چل و هەشت :

عَن عبدالله بْنَ عُمَرْ ﷺ قالَ : قالَ رَسولَ الله ﷺ {مَنْ خَلَعَ يَداً مِنْ طَاعَةٍ ، لُقِيَ اللهُ يَوْمُ الْقِيامَة لاَ حُجَةً لَهُ، وَمَنْ مَاتَ وَلَيْسَ فِي عُنُقِه بِيَعة ، مَاتَ مَيْتَةً جَاهِلِيَةٍ} رواه مسلم ١٨٥.

له (عبدالله ی کوڕی عمر) ﷺ دەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کەسێ دەست بکێشێتەوە لە گوێڕایەڵی فەرمانڕەوایی موسڵمانان دەچێتەوە خزمەت خوای گەورەو هیچ عوزرێکی نیە بۆ ئەو کارەی ، وە کەسێك بمرێ لە کاتێکدا بەیعەتی بە فەرمانڕەوای موسڵمانان نەدابێ ئەوا مردنەکەی وەکو مردنی کاتی نەفامەتییە.

## فەرموودەی چل و نۆ :

عَن ابْنِ عُمَر ﵁ قالَ : قالَ النبي ﷺ {**لاَ تَحْلفوا بآبائِكُمْ، وَمَنْ كَانَ حَالفاً فَلْيَلفْ بِاللهِ**} متفق عليه ١٦٤٦/٧٤٠١.

**له (عبدالله ی کوڕی عمر) ﵁ گوتی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سوێند مەخۆن بە باو و باپیرانتان وە هەر کەسێك سوێند دەخوا با بەخوا سوێند بیخوا.**

## فەرمووده‌ی په‌نجا :

عَن عبدالله بْنَ عُمَرْ ﵁ أَنَ رَسولَ الله ﷺ {**مَا حَقُ امرِئٍ مُسْلِمٍ لَهُ شَيْءٌ يُوصي فيهِ ، يُبيتُ لَيْلَتينِ إلا وَوَصيَّتُهُ مَكتوبَةٌ عِنْدَهُ**} ٢٧٣٨/١٦٢٧.

**هەر موسڵمانێك شتێکی هەبێ کە بیەوێ وەسیەتی بۆ بکا حەق وایە دوو شەوی بەسەردا تێنەپەڕێ هەتا وەسیەتنامەکەی بەنوسراوەیی لەلای خۆی دادەنێ.**

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ ﴿٤﴾

*********************

(قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ)

لە بڵاوكراوەكانی سەنتەری مەدینە بۆ لەبەركردنی
فەرموودەی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم )

چاپخانەی رۆژهەڵات-هەولێر
دیزاینی بەرگ